# وەڵامێکی کورت

# بۆ

## داستان محمد

لەسەر کافربوونی یاسادانەر بە
چەند ئایەتێکی سورەتی المجادلة

**بسم الله الحمد الله وصلاة وسلام على رسول الله وعلى آله وصحبه وسلم**

بەهێزترین بەڵگە لە قورئاندا لە سەر کافربوونی ئەوکە سانەی کە یاسای دیکە دادەنێن و دەیخەنە جێگای یاسای الله تعالى.

جیا لە ئایەتەکانی سـورەتی المائدە و النسـاء کە پێشـتر زیاتر باسکراون و بەرچاو کەوتون.

ئەمەش وەکو ڕەدێك بۆ نوسـەری کتێبە 400 لاپەڕەییەکە و هاوفکرەکانی.

الله تعالى لە سورەتی المجادلة ڕوداوێکمان بۆ باس دەکات کە پیاوێك بە خێزانەکەی خۆی گوتوە: تۆ وەك دایکی من وایت کە ئەم کردارەشپێی دەگوترێت ظهار، کە ئەم قسەیە لە جاهیلی دا هەر پیاوێك بە خێزانەکەی بگوتایە یەکسـەر دەبوو پیاوەکە لە خێزانەکەی جیـا ببێتەوە و تەڵاقیبـدات، جـا پیـاوێکیش کە ناوی أوسی کوڕی الصامت بوو بە خێزانەکەی گوتبو تۆ وەك دایـکـی مـن وایـت، ئـافـرەتەکەش کە نـاوی خـولەی کـچـی ثعلبە بوو حوکمی هێنابوەوە بۆ لای رسول الله علیه صلاة وسلام لەسەر ئەم قسەیە کە ڕێگەچارەیەکی بۆ بدۆزێتەوە بۆ ئەوەی چـی بـکـات، رسـول الـلـە ش پـێـی فەرمـوو: [ما أراك إلا قد حرمت علیه] واتە: هیچ شـتێك نابینم ئیلا ئەوە نەبێـت کە تۆ لەو حەرام بویـت. پـاشـان ئـافرەتەکە گوتی: [اللهم إني أشكو اليوم شدة حالي ووحدتي].

واتە: ئەی پەروەریێنم بەڕاستی من توندی و ناخۆشی و تەنیایم تەنها بۆ لای تۆدە هێنمەوە، پاشـــان اللـه تعالى ئەو چەند ئایەتەی سەرەتای سورەتی المجادلةی دابەزاند.

کە حوکمی تەلاق بۆ دیاردەی ظهار لادەبات و چەند حوکمێکی دیکە دەخاتە جێگای ( سەرچاوەی هۆکاری دابەزینی ئایەتەکە لە کۆتایی نامیلکەکە دادەنێم)

جا الله تعالى لە ئایەتی یەکەمدا دەفەرمێت:

قد سمع الله قول التي تجادلك في زوجها وتشتكي إلى الله والله يسمع تحاوركما إن الله سميع بصير( ١ المجادلة)

واتە: بەڕاستی الله تعالى گوفتاری ئەو ژنەی بیست کە لەبارەی مێردەکەیەوە گفتوگۆی لەگەڵ دەکردی و سـکاڵای خۆی بۆ لای الله تعالى دەبرد و الله گوێی لە گفتوگۆی هەردوکتان بوو بەڕاستی الله بیسەر و بینایە بە هەموو شتێك.

پاشـــان الله تعالى لە ئایەتی 3دا حوکمی نوێی دیاردەی ظهار کە چەند کەفارەتێکی نوێیە دادەبەزێنێت دەفەرمێت:

والذين يظاهرون منـنسائهم ثم يعودون لما قالوا فتحرير رقبة من قبل أن يتماسا ذلكم توعظون به والله بما تعملون خبير (٣المجادلة)

واتە: ئەوانەی (ظهار) دەکەن لەگەڵ هاو سەرەکانیان لەپا شان پە شیمان دەبنەوەو (دەیانەوێت بچنە لایان) لەوەی کەوتویانە (واتە خێرا تەڵاقیاننادەن) ئەوە پێویستە بەندەیەك ئازاد بکەن

لەپێش ئەوەی بەیەك بگەن (و بچنە لایـان) ئەم كەفـارەتەی ( كە لەســــــەرتـــان پـــێــویســــــت كـــراوە) ئـــامـــۆژگـــاری دەكرێن پێی وە الله تعالی شارەزا وئاگادارە بەوەی كە دەیكەن.

وە ئایەتی ٤ كە دەفەرمێت:

فمن لم يجد فصيام شهرين متتابعين من قبل أن يتماسا فمن لم يســـتطع فإطعام ســـتين مســـكينا ذلك لتؤمنوا بالله ورسوله وتلك حدود الله وللكافرين عذاب أليم (٤ المجادلة)

واتە: ئەمجا ئەگەر یەكێك (بەندەی) دەست نەكەوت ئەوە با دوو مانگ لە سەریەك بەڕۆژوو بێت پێش ئەوەی بچنە لای یەك ئەگەر یەكێك نەیتوانی(دوو مانگ بەڕۆژوو بێت) ئەوە با نانی شەست هەژار بدات، ئەو (كەفارەتانە كە لەسەرتان واجب كراو) بـــۆ ئەوەیە كە بەراســـــــتـــی بـــاوەڕ بـــكەن بە الـــلـــە و پێغەمبەرەكەی وە ئەوانە سنووری الله ـــن وە بۆ كافران سزای سەخت هەیە.

جا هەتا ئێرە ئەو شتانە بەیان نەبوون کە ئێمە مەبەستمانە لەوەی تکفیری یاسادانەری پێبکەین کە پابەند نیە بە حوکمی الله وە و یاسای دیکە وتازە دەخاتە جێگای حوکمی الله.
جا لەمەودوا بە دیار دەکەوێت ئێمە مەبەستمان لە چیە!

لێرەدا لە کۆتایی ئایەتەکەدا کە دەفەرمێت:
وتلك حدود الله وللكافرين عذاب أليم.
واتە: ئەوانە سنور و حدودی الله ـن وە بۆ کافران سزای سەخت هەیە.
جا لێرەدا لەوانەیە بپرسیت داخۆ ئەم ئایەتانەی پێشوو لەگەڵ چیرۆکەکانی ناوی چ پەیوەندیەکی بە کافر بوون وە کافرانەوە هەبێت؟
داخۆ بۆچی الله تعالی پاش دابەزاندنی ئەم حوکم و یاسایانە فەرمووبێتی بەڕاستی بۆ کافران سزای سەخت هەیە؟
داخۆ پەیوەندی خەولەی کچی ثەعلەبە و پیاوەکەی چیبێت بە کافربونەوە لە کاتێکدا موسوڵمانن و بە ئەوپەڕی دڵپاکیەوە حوکمی هێناوەتەوە بۆ لای رسول الله؟
با سەیری ئایەتی پاش ئەوە بکەین کە زۆر بە جوانی بۆمان ڕون دەبێتەوە مەسەلە چیە و الله تعالی چۆن و لەبەر چی ناوی کافرانی بردوە لەم ئایەتەدا.

جا ئایەتی پاش ئەوە دەفەرمێت:

إن الذين يحادون الله ورسوله كبتوا كما كبت الذين من قبلهم وقد أنزلنا آيات بينات وللكافرين عذاب مهين(٥ المجادلة)

واتە: بێگومان ئەوانەی دژایەتی و سەرپێچی الله ورسولەكەی دەكەن ڕیسوا وسەرشۆر دەكرێن هەر وەك ئەوانەی پێش ئەمان ڕیسوا وسەرشۆركران (كە چۆن نافەرمانی دەكەن) لە كاتێكدا دڵنیان كە ئێمە بەڵگەی ڕوونمان ناردۆتە خوارەوە وە بۆ كافران سزای ڕیسواكەر هەیە.

جا با لێرەدا سەیری تەفسیری زانایان بكەین لە زانایانی سەلەف و خەلەف بزانین كێن و كامانەن ئەوانەی كە دژایەتی و سەرپێچی الله دەكەن سەرپێچیەكەیان چۆنە كە لەمەوە بەڵگەكەی پتەو ومحكم هەیە بۆ ڕەددانەوە و دەمكوتكردنی نوسەری كتێبە ٤٠٠ لاپەڕە ییەكە و هاوفكرەكانی لەمەدخەلی و باقی مورجیئەكانی ئەم زەمەنە كە دەڵێن یاسادانان كوفر نیە لە بنەڕەتدا ئەو كاتە كوفرە كە بدرێتە پاڵ الله یان جەحد و ئینكاری بكرێت و ئەمە دەبەستنەوە بە كفر دون كفرەكەی ابن عباس رضي الله عنه.

ئیمـامی الطبری لە تەفســـیری ئەم ئـایەتەدا دەفەرمێـت:
[یقول تعالی ذکره: إن الذين يخالفون الله في **حدوده وفرائضه**، **فيجعلون حدودا غير حدوده، وذلك هو المحادة لله ولرسوله**.]
واتە: الله تعالی باس لەوە دەکات: ئەوانەی کە پێچەوانەی الله دەکەن لە حدود (سنورەکان) و فەرزکراوەکانیدا، چەند سنور و حەد و (یاسای) دیکە دادەنێن بێجگە لە سنور و حەد و (یاساکانی) الله، ئا ئەمە دژایەتی الله و رسولەکەیەتی]

قەولەکەی زۆر ڕون و ئاشکرایە وە ئەم قەولەش پێشکەش دەکەم بە نوسەری کتابە ٤٠٠ لاپەڕەییەکە پێش هەموو کس کە لافی سەلەف لێدەداتو پاشان بە هەموو ئەو هاوفکرانەی کە دەڵێن:[ حاکم یاســا دابنێت پێچەوانەی یاســای الله وە هەروەها یاســاکانی الله پەکبخات بە دڵی خۆی کافر نیە تاوەکو ئەم یاسایە دەداتە پاڵ الله یان جەحدی یاسای الله دەکات].
پێشــکەشــی دەکەم پێیـان و پێیـان دەڵێم: کـوا لە کـــوێــدا ئـــیـــمـــامـــی الـــطـــبـــری ئەم یاسادانانەی پەیوەست کرد بە اعتقاد و دانە پاڵ الله وە؟
زۆر زۆر بە ڕونی فەرمووی: [**فيجعلون حدودا غير حدوده، و ذلك هو المحادة لله ولرسوله**.]

ئایا لەمە وازحتر؟
له یجعلون حدودا غیر حدوده وازحتر؟
کوا کامەیە باسی اعتقاد و دانە پاڵ الله؟
کامەیە باسی اشتراطی جەحد؟
زۆر بە جوانی فەرمووی ئەوەی حەدێکی نوێ دابنێت غەیری ئەو حەدەی الله دایبەزاندوە ئەوە دژایەتی الله و رسولەکەی کردوە، جا گرنگ نیەدانانی حەدی نوێ پێش ئەوە جەحدی حوکمی الله کرابێت یان نەکرابێت گرنگ ئەوەیە دانانی حەدی نوێ غەیری حەدەکانی الله کوفرە ودژایەتی الله وە رسولەکەیەتی(کە ئەگەر ورد ببینەوە لەمە ئەوەمان بۆبەیان دەبێت کە یاسادانان خۆی لە خۆیدا جەحدە، واتە غیر ممکنە کەسێك کە جەحدی ئایەتەکان و حوکمەکانی اللە ی نەکردبێت و یاسای نوێش دژی ئەم حوکمانە دابنێت، بەڵام ئێمە دەڵێین گریمان نەشیکردبێت ئەمە هەرکوفرە)
جا لەکوێن ئەوانەی کە اجماعی سەلەف لەسەر قەولی کوفر دون کوفری ئایەتەکانی حوکم دادەبەزێنن بەسر یاسادانان؟
با بێن ئەم ئایەتەش تەئویل بکەن بزانم ئایا لە قودرەت و توانایاندا هەیە ئەم ئایەتانەی الله تعالی و قەولەکانی زانایان لێرەشدا تەئویل ی غەیری معنی حقیقیەکەی بکەن؟

جا بۆ ئەوەی بیشـیسـەلمێنین کە یاسـادانەر (ئەگەر بە زاری
خـــــۆشـــــــی بـــــڵــــیـــــێـــــت
دەزانم حوکمی الله حەقترە و ڕاستترە و حوکمی الله ــشم دەو
یـــــــــــــــــت بەڵام مـــــــــــــــــــن لەبەر
شەهوەت جێبەجێی ناکەم و یاسای دیکەم خستوەتە جێگای)
درۆدەکـــات بەم قســـــەیەی و ڕاســـــت نـــاکـــات لەوەی
کە یـــاســـــــای الـــلـــه ـــــــی دەویـــت، هەر لەم
ئایەتەدا دەیسەلمێنین کە حاکمی یاسادانەر دژی شەرعی الله
کە جەحدی ئەو شەرعە نەکات وجودی نەبوە بە هیچ جۆرێك
ڕۆژێـــك لە ڕۆژان کەســــیـــێـــك نەبـــوە بـــڵـــیـــێـــت:
[حوکمی الله ــم دەویت بەڵام جێبەجێی ناکەم یاسای گیرفان
ی خۆم دەخەمە جێگای] بەڵام ئەمە ممکنە لای داستان محمد
وجودی هەبێت،
جـاهەر ســـەیری تەفســـیری ئـیمـامی الطبری دەکەین کە
لە سەرەتا فەرمووی: دژایەتی کردنی الله و رسولەکەی هێنانی
یـــــــــــاســـــــــــــا وە
حدودێکی دیکەیە لە باتی ئەم حەدانەی الله، ئەگەر سـەیری
کۆتایی ئایەتەکە بکەین کە دەفەرمێت:
وللكافرين عذاب مهين،

الـــــــــطـــــــــبـــــــــــرى دەفەرمـــــــــــيـــــــــت:
[يقول تعالى ذكره: ولجاحدي تلك الآيات البينات التي أنزلناها على رسولنا محمد صلى الله عليه وسلم، ومنكريها عذاب يوم القيامة مهين: يعني مذل في جهنم.]
واته: الله تعالى دەفەرمێت: بۆ ئەو کەسانەی کە جەحد و ئین کاری ئەو ئایەتە ئاشـــکرا و دیارانە دەکەن کە دامانبەزاندوە بە سەر پێغەمبەر صلىالله عليه وسلم، وە ئەوانەشی ئینکاری دە کەن سـزای بە ئێشـی ڕۆژی قیامەتیان بۆ ئامادە کراوە، وە سـەر شۆر دەکرێن لە جەهەنەم.

کەواتە سەرەتا باس لە دانانی یا سای نوێ دەکات وە لە کۆتایدا کە الله تعالى باس لەوە دەکات بۆ کافران سزای بە ئێش هەیە لە تەفســـیری ئەمەدا ئیمامی الطبری دەفەرمێت بۆ ئینکاری کەرەکان ســـزای بە ئێش هەیە، کەواتە لەمەوە بەیان دەبێت کە یاسادانەر جاحدە، یاسادانەری غیرجاحد وجودی نەبوە وە نابێت و تکذیبی هەموو ئەوانە دەکات کە یاسا دادەنێن دەشـــڵێن شــــەرعی الله مان دەوێت، کەواتە ئەم کابرا داماوە ٤٠٠ لاپەڕەی لەسەر بنەمای شتێك نوسیوە ڕەدی کەسانێکی پێ داوەتەوە لەسەر کەسێك کە ئەسڵەن وجودی نیە و غیر ممکنە یاسادانەری غیر جاحد وجودی هەبێت.

ئیمامی ابن کثیریش بەهەمان شێوە لە تەفسیری کۆتایی ئایەتەکەدا دەفەرمێت:
[{وللكفرين عذاب مهين} أي: في مقابلة ما استكبروا **عن اتباع شرع الله والانقياد له والخضوع لديه**]
واتە: ئەمە مانای ئەوەیە کە: ئەم سزایە لە بەرامبەری ئەو خۆ بەگەورەزانینەیان کە شوێنی شەرعی الله نەکەوتون و پابەند و ملکەچی نەبوون بوو.

واتە تکفیر و سزای هەمیشەیی الله تعالی بۆ ئەو کە سانەیە کە شوێنی شەرعی الله ناکەون و پابەندی نابن!
دەی ئایا یاسادانەر کە پێچەوانەی شەرع یاسا دادەنێت شوێنی شەرعی الله کەوتوە؟
پابەندی بوە؟
ملکەچی بوە؟
کەسێك کە پابەندی حوکمەکانی الله بێت ئایا یاسای دیکە دادەنێت غەیری ئەو یاسایانە؟
کە ئەمە زۆر بە ئاشکرایی هاوار دەکات کە مەبەستی لە یا سادانەرە ئەو یا سادانەرەی نو سەری کتابە ٤٠٠ لاپەڕەییەکە دەڵێت کافر نییەئەگەر یاساکەی نەداتە پاڵ الله یان جەحدی حوکمی الله نەکات.

با چەند قەولێکی دیکەی زیادەی زانایان دانێین لەسـەر ئایەتە کە وەکو نوسـەری کتێبە ٤٠٠ لاپەڕەیەکە دەڵێت وەکو ئەوەیە گولەی زیادە بنێین بەلاشەیەکی مردوەوە.

البیضـاوی (ت ٦٥٨هـــــ) لەسـەر تەفسـیری یحادون دەڵێ: [أو یضعون أو یختارون حدودا غیر حدودهما].
واتە: یـــان دادەنـــێـــن یـــان حەدێـــکـــی دیـــکە هەڵدەبژێرن غەیری حەدەکانی الله.

السیوطی(ت ٩١١هـ) لەسەر یحادون دەلێ: یخالفون واتە: سەر پێچی دەکەن.

برهان الدین البقاعي (ت٨٨٥ هـــــ) لەسـەر یحادون دەڵێت: [**أي یغالبون الملك الأعلى على حدوده ليجعلوا حدودا غيرها، وذلك صورته صورة العداوة**]
واتە: مانای ئەوەیە دژایەتی پادشای بەرز و بڵند دەکەن لە حدود و سنورەکانی، بەوەی کە حەد و سنوری دیکە دادەنێن غەیری ئەوانەی ئەودایناوە، وە وێنەی ئەمەش لە وێنەی دژایە تی کردنە.

زۆر بە ئاشکرا دیارە لەم قەولەدا کە دانانی حەد و یاسای نوێ و تازە دژی حەدویاساکانی الله تعالی دژایەتی کردنی الله ـیە جا باخەڵکانێك بڵێن دژایەتی نیە.

کەواتە بە کوردی و بە کورتی، یاسادانان واتا دانانی چەند قانونێکی نوێ کە لە کتێبێکدا بە ناوی دەستوور کۆدەبنەوە کە تیایدا قاضی وخەڵکی و تاك و کۆ و تاوانبار و تاوانبەسەرکراو پەیوەست دەکرێن بە پابەند بوون بەن قوانینانەوە، بۆ نمونە کە لە دەستووردا گوترا زیناکار هیچ حوکمیکی نیە ئەمە واتا زیناکار ئازادە، یان قانونێك بڵێت شاهیدی ژن وەکو شاهیدی پیاوە یان بڵێت لە میراتدا ژن و پیاو یەك بەشیان پێدەدەین یان بڵێت ڕێگە دەدەین بە مارەکردن بێ وەلی ئەمر یان بە یاسا ڕێگە بدات بە ڕیبا و بە مشروباتی کحولی الی آخرە جا ئیترئەگەر حوکمی الله یان بویستایە و ئیرادەیان لە تطبیق کردنی ئەم حوکمە هەبوایە ئەوە دەیانکرد، بەڵام درۆ دەکەن نە حوکمی اللە یان دەوێت نە حەزیشیان لێیەتی، ئەو کەسەش کە دەڵێت ئەمە وەلی ئەمری موسەڵمانانە ئەویش هەر درۆ دەکات هەر وەکو وەلی ئەمرە کافرەکەی چونکە ممکن نیە حاکم شەرعی اللەی بوێت و پەکیشی بخات، یانی هەم دەیەوێت هەم نایەوێت،

بـــانـــيـێـــكـه و دوو هەوا، بە كـــورتـــى حـــاكـــمـــى يـــاســـــــادانەرى جەحد نەكەرمان نەبوە و نابێت بە تەحەداوە تا ڕۆژى قيامەت.

هۆكارى دابەزينى ئايەتەكان

حدثنا ابن حميد، قال: ثنا مهران، عن أبي معشـر المدني، عن محمد بن كعب القرظي، قال: كانت خولة ابنة ثعلبة تحت أوس بن الصــامت،وكان رجلا به لمم، فقال في بعض هجراته: أنت ع لي كظهر أمي، ثم ندم على ما قال، فقال لها: ما أظنك إلا قد ح رمت علي قالت: لا تقل ذلك،فوالله ما أحب الله طلاقا. قالت: أئ ت رسول الله صلى الله عليه وسلم فسله، فقال: إني أجدني أ ستحي منه أن أسأله عن هذا، فقالت: فدعنيأن أسأله، فقال لها : سليه فجاءت إلى رسول الله صلى الله عليه وسلم، فقالت: يا نبي الله إن أوس بن الصامت أبو ولدي، وأحب الناس إلي،قد قال كلمة، والذي أنزل عليك الكتاب ما ذكر طلاقا، قال: أنت علي ك ظهر أمي، فقال النبي صـــلى الله عليه وســـلم: « حد يث : ما أراك إلا قد حرمت عليه »، تفسير : قالت: لا تقل ذلك يا نبي ا لله، والله ما ذكر طلاقا فرادت النبي صلى الله عليه وسلم مرارا، ثم قالت: اللهم إني أشكو اليوم شدة حالي ووحدتي، وما يشق علي من فراقه، اللهم فأنزل على لسان نبيك، فلم ترم مكانها حتى أنزل الله {قد ســمعالله قول التي تجادلك في زوجها وت شتكي إلى الله} إلى أن ذكر الكفارات، فدعاه النبي صلى الله ع ليه وسلم فقال: « حديث :

أعتق رقبة »، تفسير : فقال لا أجد، فقال: « حديث :
صم شهرين متتابعين » تفسير : قال: لا أستطيع، إني لأصوم ال
يـــوم الـــواحـــد فـــيشـــــــق عـــلـــي قـــال: « حـــديـــث :
مأطعم ستين مسكينا؟ » تفسير : قال: أما هذا فنعم